بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدللّٰه ، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين ، أما بعد

## پێشەکی

ئیمامی بوخاری عەقیدەی ئەهلی سوننەی بە کورتی باسکردووە کە لە زاناکانی هەموو ناوچەکان پێی گەشتووە واتە کۆدەنگی هەموویانە بابەتێکی کورتەو سودێکی زۆرو گرنگی هەیە ئیمام گەشتووە بە زیاتر لە هەزار شێخ کە لەسەر ئەم بیرو باوەڕە کۆك بوون و ڕاجیاوازیان نەبووە جیل بە جیل هەموویان لەسەر ئەم عەقیدەیە بوون ، عەقیدەکە باسێکی کورتە بەڵام تا بڵێی بەسوودە بۆ شارەزا بوون لە عەقیدەی ئەهلی سوننە ، جا بۆیە لێرە هەستاین بە کردنەوە کوردی عەقیدەکەی ئیمامی بوخاری بۆ ئەوەی خەڵکی زیاتر شارەزای عەقیدەی سوننە بێت و دوور بکەوێتە لە لادان و تێکەڵی ئەهلی بیدەع ، اللّٰه بیکاتە ئەهلی هۆکاری شارەزایی بۆ هەموان و توێشووی قیامەتیش بۆ ئێمە إِنْ شَاءَ الله.

## كورتەيەك لە ژيانى پێشەوا بوخارى رحمه الله :

ناوى تەواوى: محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة بن بردزبه ناسناوى: أبو عبدالله ، لە ساڵى(١٩٤هـ) لە بوخارا لە دايك بووە كە شارێكە لە أوزبكستان ، ناوبانگى ئيمامى بوخارى(صاحب الصحيح) واتە خاوەنى فەرموودەى صحيح كە مەبەست لێى صحيح بوخارييە ، لە قەڕنى سێيەمى هيجرى ژياوە ، هەروەها دواى چەندين دەربەدەرى كە بەسەرى هات دواجا لە سەمەرقەند كە دووەم شارى گەورەيە لە أوزبكستان لە ساڵى(٢٥٦هـ) كۆچى دوايى دەكات ڕەحمەتى الله ى لێبێت.

ئيمامى بوخارى هەر بە منداڵى باوكى دەمرێت و لە كۆشى دايكيدا پەروەردە دەبێت ، دايكى زۆر پێوەىماندوو دەبێت بەجۆرێك خۆى دەيباتە لاى زانايان تا دەرس بخوێنێت و شارەزاى شەريعەت بێت ، وە هەموو پێداويستيەكى كوڕەكەى پڕ دەكاتەوە تا لە هيچى كەم نەبێت و بتوانێت شارەزاى دينەكەى بێت هەر بۆيە ئەو كەسەى لێ دەرچوو كە ئێستە لە هەموو جيهاندا ناوى دەركردووە و ناويشى هەر بە زيندوويى دەمێنێتەوە ، ئيمامى بوخارى بە جۆرێك بووە يەك جار شتێكى بخوێندايەتەوە ڕاستەوخۆ لەبەرى دەكرد حفظێكى زۆر بەهێزى هەبووە ، لە منداڵيدا چاوەكانى لە دەست دەدات و دواتر بە شێوەيەكى موعجيزە ئاسا بۆى

دەگەڕێتەوە لەم بارەیەوە :

محمد بن الفضل البلخي دەڵێت : محمد بن إسماعیل چاوەكانی لەدەست دا بە منداڵی و كوێر بوو ، دایكی لە خەودا پێغەمبەر إبراهیم الخلیل علیە السلام بینی پێی فەرموو : ئەوە اللّٰه بینایی گەڕاندەوە بۆ چاوەكانی كوڕەكەت لەبەر زۆری گریانت یان زۆری دوعا كردنت ، جا كاتێك بەیانی دەكاتەوە سەیر دەكات كوڕەكەی واتە ئیمامی بوخاری بینایی گەڕاوەتەوە بۆ چاوەكانی و بە باشی دەتوانێ ببینێ[1] .

---

تهذیب الكمال (٢٤/٤٣٠)

والسیر(١٢/٣٩١)

## هەندێک لە ماموٚستاکانی ئیمام :

١- أحمد بن حنبل(٢٤١هـ)

٢- علي بن المديني(٢٣٤هـ)

٣- يحيى بن معين(٢٣٣هـ)

٤- إسحاق بن راهويه(٢٣٨هـ)

## لە خوێندکارە دیارەکانی ئیمام :

١- مسلم بن الحجاج(٢٦١هـ)

٢- ابن أبي عاصم(٢٨٧هـ)

٣- أبو عيسى محمد الترمذي(٢٧٩هـ)

٤- محمد بن إسحاق بن خزيمة(٣١١هـ)

وەسفی زانایان لەسەری :

قال نعيم بن حماد : محمد بن إسماعيل فقيه هذه الأمة.

نعيم بن حماد(٢٢٨ه) دەڵێت: محمد بن إسماعيل فەقیهی ئەم ئومەتەیە.

قال أحمد بن حنبل : لم يجئنا من خراسان مثل محمد بن إسماعيل.

أحمد بن حنبل(٢٤١ه) دەڵێت: نەهاتووە بۆ لامان لە خوراسانەوە بە وێنەی محمد بن إسماعيل.

قال أبو حاتم الرازي : محمد بن إسماعيل أعلم من دخل العراق.

أبو حاتم الرازي(٢٧٧ه) دەڵێت: محمد بن اسماعيل زاناترینە بەوانەی چوونەتە ناو عێڕاق.

قال ابن خزيمة: ما رأيت تحت أديم السماء أعلم بحديث رسول الله ﷺ وأحفظ له من محمد بن إسماعيل.

ابن خزيمة(٣١١هـ) دەڵێت: لەژێر سەقفی ئاسماندا کەسم نەدیوە شارەزاتر بێت بە فەرموودەی رسول الله ﷺ ، وە حفظی زیاتر بێت بە هێندەی محمد بن إسماعيل البخاري.

---

(١٢/٣٩١) (تهذيب الكمال) (٢٤/ ٤٣٠)، و(السير)

ئیمامی اللالكائي(٤١٨ه) رحمەاللە لە كتاب السنة دەڵێت: بیروباوەڕی باوكی عبداللە محمد بن إسماعیل البخاري و حاڵی لەگەڵ كۆمەڵێك لە سەلەف كە ڕیوایەتی كردووە لێیانەوە :

أحمد بن محمد بن جعفر الهروي هەواڵی پێداین، ووتی: محمد بن أحمد بن محمد بن سلمة بۆی گێڕاینەوە ، ووتی: أبو الحسین محمد بن عمران بن موسى الجرجاني بۆی گێڕاینەوە، ووتی: بیستم باوكی محمد عبد الرحمن بن محمد بن عبد الرحمن البخاري - بالشاش - دەیوت : بیستم باوكی عبداللە محمد بن إسماعیل البخاري دەیوت : گەشتووم بە زیاتر لە هەزار پیاو لە ئەهلی عیلم : ئەهلی الحجاز، و مكة، و المدینة، و الكوفة، و البصرة، و واسط، و بغداد، و الشام، و مصر، گەیشتوم پێیان چەندەها جار چین لە دوای چین ، پاشان چین لە دوای چین ، گەیشتوم پێیان و وە ئەوان زۆر بوون لە ماوەی زیاتر لە (٤٦) ساڵ :

ئەهلی شام، ومصر، والجزیرة دووجار ، وە البصرة چوار جار لە ساڵانی ڕابردوو بە ژمارەیەك ، وە لە حیجاز شەش ساڵ :

وە من حسابی ئەوە ناکەم کە چەند چوومە ناو کوفە و بەغداد لەگەڵ فەرموودەناسەکانی ئەهلی خوراسان ،

ئەوان: المكي بن إبراهيم، و يحيى بن يحيى، و علي بن الحسن بن شقيق، و قتيبة بن سعيد، و شهاب بن معمر.

وە لە شام: محمد بن يوسف الفريابي، و أبو مسهر عبد الأعلى بن مشهر، و أبو المغيرة عبد القدوس بن الحجاج، و أبو اليمان الحكم بن نافع، وە لە دوای ئەوانیش ژمارەیەکی زۆرتر هەبوون.

وە لە مصر: يحيى بن بكير، و أبو صالح كاتب الليث بن سعد، و سعيد بن أبي مريم، و أصبغ بن الفرج، و نعيم بن حماد.

وە لە مەککە: عبدالله بن يزيد المقرئ، و الحميدي، و سليمان بن حرب قاضي مكة، و أحمد بن محمد الأزرقي.

وە لە مەدینە: إسماعيل بن أبي أويس، و مطرف بن عبدالله ، و عبدالله بن نافع الزبيري، و أحمد بن أبي بكر أبو مصعب الزهري، و إبراهيم بن حمزة الزبيري، و إبراهيم بن المنذر الحزامي.

وە لە بەصرە: أبو عاصم الضحاك بن مخلد الشيباني، و أبو الوليد هشام بن عبد الملك"، و الحجاج بن المنهال، و علي بن عبدالله بن جعفر المديني.

وە لە كوفە: أبو نعيم الفضل بن دكين، و عبيدالله بن موسى، و أحمد بن يونس، و قبيصة بن عقبة، وابن نمير ، وعبدالله وعثمان ابنا أبي شيبة.

وە لە بەغداد: أحمد بن حنبل، و يحيى بن معين، و أبا معمر، و أبا خيثمة، و أبا عبيد القاسم بن سلام.

وە لە ئەهلى الجزيرة: عمرو بن خالد الحراني.

وە لە واسط: عمرو بن عون، و عاصم بن علي بن عاصم.

وە لە مرو: صدقة بن الفضل، و إسحاق بن إبراهيم الحنظلي.

ئێمە ناوی ئەم کەسانەمان هەڵبژارد بۆ ئەوەی کورت بێت و زۆری نەخایەنێت ، من هەرگیز یەکێک لەوانەم نەبینیوە کە لەگەڵ ئەم شتانەدا ناکۆک بێت :

١- أن الدين قول وفعل

وذلك لقول الله تعالى: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ (البينة: ٥)

١- کە دین وتەو کردارە

وە لەبەر وتەی الله تعالى: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ (البينة: ٥)

واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێک و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەڕێک و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی الله.

٢- وأن القرآن كلام الله غير مخلوق

لقوله تعالى: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ ﴾ (الأعراف: ٥٤).

قال أبو عبدالله محمد بن إسماعيل : قال ابن عيينة : فبين الله الخلق من الأمر لقوله تعالى: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (الأعراف: ٥٤).

٢- وە قورئان وتەی اللە یە و مەخلوق نییە

لەبەر وتەی اللە تعالى: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴾ (الأعراف: ٥٤).

واتە: بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە پاشان(اللە) چووە سەر عەرش (ئێمە ئیمانمان پێ یەتی بەڵام شێوەکەی نازانین) بە( تاریکایی) شەو( ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بەپێچەوانەشەوە) (ڕۆژ بەشوێن شەووەوەیە بە خێرایی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش ژێر بار کراوون بەفەرمانی

خۆی بێدار بن کە بەدی هێنان و فەرماندان هەر بۆ اللّٰه یە.

باوکی عبداللّٰه محمد بن إسماعیل دەڵێت : ابن عیینة(١٩٨هـ) فەرموویەتی : وە اللّٰه (الخلق) جیاکردەوە لە (الأمر) لەبەر وتەی اللّٰه تعالی : ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (الأعراف: ٥٤).

٣- وأن الخير والشر بقدر؛

لقوله تعالى: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ (الفلق ).

ولقوله تعالى: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (الصافات : ٩٦) ولقوله : ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر: ٤٩)

٣- وە خێر و شەڕ بە قەدەرە.

لەبەر وتەی اللّٰه تعالی : ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾

واتە: بڵێ: پەنا دەگرم بەو پەروەردگارەی کە بەرەبەیان پێش دەهێنێت ، لە شەڕ و خراپەی هەرچی کە دروستی کردووە.

وە لەبەر وتەی اللّٰه تعالی: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (الصافات: ٩٦)

واتە: وە اللّٰه بەدیهێنەری ئێوەیش و ئەم بتانەشە کە دروستتان کردوون (نەشیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن!!).

وە لەبەر وتەی اللّٰه تعالی: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر: ٤٩)

واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە.

٤- ولم يكونوا يكفرون أحدا من أهل القبلة بالذنب

لقوله: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ (النساء: ٤٨)

٤- وە ئەوان هیچ کەسێکیان تەکفیر نەدەکرد لە ئەهلی قیبلە بە تاوان ، لەبەر وتەی اللّٰه تعالی : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ (النساء: ٤٨)

واتە : بەڕاستی اللّٰه خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت.

٥- وما رأيتُ منهم أحدا يتناول أصحاب محمد ﷺ

قالت عائشة : أمروا أن يستغفروا لهم.

وذلك قوله: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ (الحشر : ١٠)

٥- وە نەمدیوە هیچ یەکێک لەوان تانە بدات لە هاوەڵانی محمد ﷺ

عائشة رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها دەڵێت: فەرمان کراوە بەوەی داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەن.

وە بەهەمان شێوە وتەی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ الحشر : ١٠)

واتە: ئەوانەش کە بە شوین کۆچبەران و پشتیوانانندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دوعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و لەو برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ بوغزو کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، جۆرە پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندە و میهرەبانیت.

٦- وكانوا ينهون عن البدع : ما لم يكن عليه النبي ﷺ وأصحابه

لقوله : ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ (آل عمران: ١٠٣)

ولقوله : ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ ﴾ (النور: ٥٤)

٦- وە ئەوان نەهیان دەكرد لەبیدعە : مادەم لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیەوە نەهاتبێ.

لەبەر وتەی: ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ (آل عمران: ١٠٣)

واتە: هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی اللہ وەو پەرت و بڵاو مەبن.

وە وتەی : ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ ﴾ (النور: ٥٤)

واتە: خۆ ئەگەر فەرمانبەرداری بن و گوێڕایەڵ و ملكەچ بن بە ڕاستی ئەوە هیدایەت وەردەگرن.

٧- ويحثون على ما كان عليه النبي ﷺ وأتباعه

لقوله : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (الأنعام : ١٥٣)

٧- وە سووربوون لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتوانی لەسەریبون ، لەبەر وتەی: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (الأنعام : ١٥٣)

واتە : بێگومان ئەمەی کە باسکرا ڕێبازی منە کە ڕاستە دە ئێوەش شوێنی بکەون (دەهەم) شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە جیاتان دەکاتەوە لە ڕێبازی اللە ، ئەوەش پەروەردگارتان فەرمانی پێ کردوون، بۆ ئەوەی خواناس و پارێزکار بن.

٨- وأن لا تنازع الأمر أهله ; لقول النبي ﷺ : ثلاث لا يغل عليهن قلب امرىء مسلم : إخلاص العمل الله ، وطاعة ولاة الأمر ولزوم جماعتهم فإن دعوتهم تحيط من ورائهم ثم أكد في قوله: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ (النساء: ٥٩).

٨- وە ناکۆکی و کێشە نانێنەوە لەگەڵ وەلی ئەمری خەڵکەکە ، لەبەر وتەی پێغەمبەر(ﷺ) : سێ شت دڵی موسوڵمان تێیدا چەواشە ناکرێ : بە ئیخلاص و بە پاکی کارکردن بۆ اللە ، وە گوێڕایەڵی وەلی ئەمرەکان ، وە

پەیوەست بوون بە جەماعەتەوە ، لەبەر ئەوە بانگەشە بۆ ئیسلام بە پشتیوانی ئەوان دەکێت . پاشان دڵنیای دەکاتەوە لە وتەی: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾ (النساء: ٥٩).

واتە : فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی اللە و پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا).

٩- وأن لا نرى السيف على أمة محمد ﷺ.

٩- وە شمشێر نابینین لەسەر ئومەتی محمد ﷺ.

١٠- وقال الفضيل: لو كانت لي دعوة مستجابة لم أجعلها إلا في إمام لأنه إذا صلح الإمام أمن البلاد والعباد.

قال ابن المبارك : يا معلم الخير، من يجترئ على هذا غيرك.

١٠- الفضيل بن عياض(١٨٧ه) دەڵێت : ئەگەر یەک دوعام هەبێت جواب بدرێتەوەو لێم قەبوڵ بکرێ نایکەم ئیللا بۆ پێشەوای موسوڵمانان نەبێت ، لەبەر ئەوەی ئەگەر پێشەوا چاک بوو ناوچەو خەڵکەکەش ئەمین دەبن.

ابن المبارك(١٨١هـ) دەڵێت : ئەی مامۆستای خێر ، کێ هەیە جورئەت بکات لەسەر ئەمە بێجگە تۆ.

عقيدة مختصرة في بعض أبواب السنة

مجمل العقيدة : هذه عقيدة مختصرة ذكر فيها الإمام البخاري رحمه‌الله بعض أبواب السنة والاعتقاد.

عەقیدەی کورتکراوەتەوە لە هەندێک لە بەشەکانی سوننەت

عەقیدەی گشتی : ئەمە بیر و باوەڕی کورتکراوەیە تێیدا ئیمامی بوخاری رحمه‌الله باسی کردووە هەندێک لە بەشەکانی سوننەت و بیرو باوەڕ.

مصدر العقيدة :

ذكر هذه العقيدة الحاكم في (تاريخ نيسابور).

.ونقلها ابن القيم في (الصواعق المرسلة) كما في (مختصر الصواعق) (٤/١٣٤٨)

سەرچاوەی عەقیدە :

الحاكم(٤٠٥هـ) باسی ئەم عەقیدەیەی کردووە لە ( تاريخ نيسابور ) وە ابن القيم(٧٥١هـ) نقڵی کردووە لە ( الصواعق المرسلة ) وەک لە ( مختصر الصواعق ) (٤/١٣٤٨) هاتووە.

قال الحاكم :

سمعت أبا الوليد حسان بن محمد الفقيه، يقول: سمعت محمد بن نعيم، يقول: سألت محمد بن إسماعيل البخاري لما وقع ما وقع من شأنه عن الإيمان فقال :

الحاكم(٤٠٥هـ) دەڵێت : بیستم أبا الوليد حسان بن محمد الفقيه ، دەیوت: بیستم محمد بن نعيم ، دەیوت: پرسیم لە محمد بن إسماعيل البخاري کاتێک کە چی ڕوویدا دەربارەی ئیمان فەرمووی :

١- قول وعمل.

١- وتەو کردەوەیە.

٢- ويزيد وينقص.

٢- وە زیاد و کەم دەکات.

٣- والقرآن كلام الله غير مخلوق.

٣- وە قورئان وتەی الله یەو مەخلوق نییە.

٤- وأفضل أصحاب رسول الله ﷺ: أبو بكر، ثم عمر، ثم عثمان، ثم علي على هذا حييت، وعليه أموت، وعليه أبعث إن شاء الله.

٤- وە باشترین هاوەڵەکانی رسول الله ﷺ ، أبو بكر ، پاشان عومەر ، پاشان عوسمان ، پاشان عەلی رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُم ، لەسەر ئەمە دەژین ، وە لەسەری دەمرین ، وە لەسەری زیندوو دەبینەوە إِنْ شَاءَ اللّٰه.

ئەم عەقیدەیەی محمد بن إسماعيل البخاري دەرهێنراوە لەکتابی (الجامع في عقائد ورسائل أهل السنة والأثر عادل آل حمدان).

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين